بەختیاری

ئینگلیزی - کوردی

# بنوو

# خودا بێدارە!

ئامادەکردن و وەرگێڕانی

سەلمان باقی

# پێناسی کتێب


ناوی کتێب : بنوو، خودا بێداره!

ئامادەکرن و وەرگێرانی: سەلمان باقی

دیزاین: دارەوان یاسین

پێداچوونەوەی: حیدەر ئیبراهیم

نرخ: ٤٠٠٠

ناوەندی بڵاوکار: کتێبخانەی بەختیاری

چاپخانە: تاران

تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

نۆبەتی چاپ: یەکەم



Bakhtiary Bookshop

Ktebxany baxtiary

0750 500 0122

بەختیاری

## بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

خوێنەری خۆشەویست، ئەم کتێبەی لە بەردەستدایە کۆکراوەی کۆمەڵێك وتەی جوان و مانابەخشە.
کتێبێکی ئیلهام بەخشە وات لێ دەکات خۆتت خۆش بوێت و ببیت بە کەسێکی خۆڕاگر و سەرکەوتوو.
دوای هەوڵ و گەڕانێکی زۆر هەوڵم داوە جوانترین و پڕ ماناترین وتە لە زۆرترین سەرچاوەوە کۆ بکەمەوە.
وتەکانی نێو ئەم کتێبە بەسەر شەش بابەتی سەرەکیدا دابەش بوون.
هیوادارم لە ڕێی ئەم وتانەوە ئارامی و حیکمەت و خۆشەویستی بدۆزیتەوە.

**سەلمان باقی**
**پایزی ٢٠٢٢**

# پێڕست




Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایان سارا نامیق کراوە بەpdf**
**پێویستی بە دوعایە دوعای خێری بۆ بکەن**

چەنال
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

How beautiful are those moments
in which you turn to Allah and know
He is the only One who can grant you
relief from your distress
And how beautiful is the relief that comes
after hardship.

چەند جوانن ئەو ساتانەی کە ڕوو لە خودا
دەکەیت و دەزانیت ئەو تاکە کەسە کە دەتوانێت
لە نارەحەتیی و سەختییەکانتەوە حەسانەوە و
پشوت پێ ببەخشێت. چەند جوانە ئەو
حەسانەوەیەی کە لە دوای سەختی و ناخۆشی دێت.

Yusuf knew that all the doors were closed.
And yet, he ran towards them because he knew Allah would open them for him.
If all the doors seem closed to you, keep running For you and Yusuf have the same Allah.

یوسف دەیزانی کە هەموو دەرگاکان داخرابوون.
سەرەڕای ئەوەش، ڕایکرد بەرەو ڕویان چونکە دەیزانی خودا دەرگاکانی بۆ دەکاتەوە.
گەر هەموو دەرگاکان بەڕووتدا داخران،
لە ڕاکردن بەردەوام بە چونکە تۆ و یوسف هەمان خوداتان هەیە.

How beautiful it is that Allah gives us countless opportunities to turn to Him. No matter what you have done, or how far you have gone, His doors of Mercy are always open, Turn back to Him.

چەند جوانە خودا دەرفەتی بێشومارمان پێدەبەخشێت تا ڕوو لە خۆی بکەین. گرنگ نییە چیت ئەنجام داوە، یان چەند دوور ڕۆشتویت، دەرگاکانی میهرەبانیی ئەو هەمیشە کراوەن، بگەڕێوە بۆ لای.

The only way to stop any pain in your life is to accept the fact that, nothing is yours, nothing was yours, and nothing will ever be yours They are worldly attachments; given by Allah, belonging to Allah and returning back to Allah.

تاکە ڕێگە بۆ وەستاندنی هەر ئازارێک لە ژیانتدا ئەوەیەکە ئەو ڕاستییە قبول بکەیت کە، هیچ شتێک هیی تۆ نییە، هیچ شتێک هیی تۆ نەبووە، وە هیچ شتێک هەرگیز نابێت بە هیی تۆ ئەوانە دروستکراوی دونیایین؛ لەلایەن خوداوە دەبەخشرێن، تایبەتن بە خودا و دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا.

Don't ever be afraid of giving.
Give. Give of your time, your forgiveness, your understanding, your love. Give of your money. Give to the creation, and you'll be given by the Creator. Be generous, and the Most Generous will be generous with you.

هەرگیز لە بەخشین مەترسە.
ببەخشە. لە کاتەکانت ببەخشە، لێبوردنەکەت، تێگەیشتنت، خۆشەویستییەکەت. لە پارەکەت ببەخشە. ببەخشە بە دروستکراوەکان، لەلایەن دروستکەرەوە پێت دەبەخشرێت بەخشندە بە، بەخشندەترینیش لەگەڵتدا بەخشندە دەبێت.

That's the thing about this world.
It never gives us only one kind of path.
There is pain. Yes. And loss. And even darkness. But there is also light. There is hope. There is beauty. And there is also love and happiness.

شتێک هەیە سەبارەت بەم جیهانە ئەوەیە.
هەرگیز تەنها یەک جۆر ڕێگامان پێ نادات.
بەڵێ. ڕێی ئازارهەیە. لەدەستدان هەیە. تەنانەت تاریکیش هەیە. بەڵام ڕووناکیش هەیە. هیواش هەیە. جوانی هەیە.
خۆشەویستی و بەختەوەریش بونیان هەیە.

When someone hurts you, your first thought may be to wish you had never met them at all. But remember that even those who've hurt you, came into your life for a reason, and left for a reason. It's for the best and healing starts with acceptance.

کاتێک کەسێک ئازارت دەدات، ڕەنگە یەکەم بیرکردنەوەت ئەوە بێت خۆزگە بخوازیت هەرگیز چاوت پێی نەکەوتایە و نەتناسیبایە بەڵام لەبیرت بێت تەنانەت ئەوانەی ئازاریان داویت، بە هۆکارێک هاتوونەتە ناو ژیانتەوە، بە هۆکارێک ڕۆیشتوون. ئەوە بۆ باشترین شتە و چاکبوونەوە لە قبوڵکردنەوە دەست پێ دەکات.

When you treat people well, those same people might not treat you the same way. But if you pay attention, you'll notice that Allah has sent other people who treat you even better.

کاتێک بە باشی مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا دەکەیت، ڕەنگە هەمان ئەو کەسانە بە هەمان شێوە مامەڵەت لەگەڵ نەکەن.بەڵام گەرسەرنج بدەیت، تێبینیی ئەوە دەکەیت کە خودا کەسانی دیکەی ناردووە کە لەوان باشتر مامەڵەت لەگەڵ دەکەن.

Every Hour has its own value. Every minute is precious. Every second is irreplaceable. Thank Allah for the time you have, be it little. If you thank Allah for something, He will surely increase it in its blessings.

هەر کاتژمێرێک بەهای خۆی هەیە. هەموو خولەکێک بەنرخە.هیچ چرکەیەک جێگرەوەی نییە. سوپاسی خودا بکە بۆ ئەو کاتەی کە هەتە،
گەرکەمیش بێت. ئەگەر بۆ شتێک سوپاسی خودا بکەیت، بە دڵنیاییەوە لە نیعمەتەکانیدا زیادی دەکات.

Allah will never leave you empty.
He will replace everything you have lost.
If He ask you to put something down,
its because He wants you to pick up
something greater.

خودا هەرگیز بە دەستی خاڵی جێت ناهێڵێت.
جێگای هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە بۆت کە لە دەستت
داون گەر داوای لێکردیت شتێک دابنێیت،
ئەوە لەبەر ئەوەیە کە دەیەوێت شتێکی گەورەتر
هەڵبگریتەوە.

Nothing in your life happens randomly.
Allah knows what He is doing to help you return to Him in the best way possible.
You have to trust His Plan.
He has planned it right to the last detail!

هیچ شتێک لە ژیانتدا بە شێوەیەکی هەڕەمەکی ڕوونادات.
خودا دەزانێت چی دەکات بۆ ئەوەی یارمەتیت بدات بە باشترین شێوە بگەڕێیتەوە لای.
پێویستە متمانە بە پلانەکەی بکەیت.
تا دوا وردەکاری پلانی بۆ داناوە!

How Merciful is Allah! When you commit a sin, it's recorded as one sin.
If you intend to do a good deed but end up doing it, it's still recorded as one good deed.
When you actually do it, it's recorded as ten!

خودا چەندە میهرەبانە! کاتێک گوناهێک دەکەیت وەک یەک گوناه تۆمار دەکرێت.
ئەگەر بەنیازی ئەنجامدانی کارێکی باش بیت، بەڵام ئەنجامیشی نەدەیت، ئەوا هێشتا وەک یەک کردەوەی باش تۆمار دەکرێت کاتێک بە ڕاستی ئەنجامی دەدەیت، وەک (دە) کردەوەی چاکە تۆمار دەکرێت!

Whenever something good from you is taken remind yourself that perhaps the thing you believed was good is not good for you, hence it was removed by the will of Allah, as a blessing.

هەرکاتێک شتێکی باشت لێ سەندرایەوە، بیری خۆت بهێنەرەوە کە ڕەنگە ئەو شتەی کە پێت وابوو باشە، باش نەبێت بۆت، هەربۆیە وەک بەخششێک بە ویستی خودا لێت سەندرایەوە.

The sea did not drown Musa.
The fire did not burn Ibrahim.
The knife did not kill Ismaeel.
The whale did not eat Yunus.
Be with Allah,
Allah will be with you.

دەریا موسای نەخنکاند.
ئاگرەکە ئیبراهیمی نەسووتاند.
چەقۆکە ئیسماعیلی سەرنەبڕی.
نەهەنگەکە یونسی نەخوارد.
لەگەڵ خودا بە،
خودا لەگەڵت دەبێت.

When Allah grants us the sense to
ask Him for forgiveness,
then He has granted us a huge favor.
It's a sign that He wants to forgive us.

کاتێک خودا ئەو هەستەمان پێدەبەخشێت
کە داوای لێخۆشبوونی لێ بکەین،
ئەوا نیعمەتێکی گەورەی پێبەخشیوین.
نیشانەیە کە دەیەوێت لێمان خۆش بێت.

We wonder why Allah doesn't grant our wishes to us immediately after we pray. But we never wonder why he doesn't punish us immediately after we sin.

پێمان سەیرە بۆچی دوای هەر نزاکردنێک
دەستبەجێ خودا ئاواتەکانمان ناهێنێتە دی.
بەڵام هەرگیز پێمان سەیر نییە بۆچی
دوای گوناهکردنمان دەستبەجێ سزامان نادات.

The hardest thing is to give up something you love, for the sake of Allah. But remember Allah never takes without giving something better.

قورسترین شت ئەوەیە لەبەر خودا واز لەو شتە بهێنیت کە خۆشت دەوێ بەڵام بیرت بێ، خودا هەرگیز بەبێ بەخشینی شتێکی باشتر هیچ ناسێنێتەوە.

When you forget that you need Allah,
He puts you in a situation that causes
you to call upon him.
And that's for your own good.

کاتێک بیرت دەچێت کە پێویستت بە خودایە،
دەتخاتە دۆخێکەوە کە دەبێتە هۆی
ئەوەی بانگی بکەیت.
وە ئەوەش بۆ باشیی خۆتە.

Sometimes Allah gives you things
that you never prayed for, that is because
He always knows what you need when you
didn't even know.

هەندێک جار خودا شتانێکت پێدەبەخشێت
کە هەرگیز دوعات بۆ نەکردوون، ئەوەش لەبەر ئەوەیە
هەمیشە دەزانێت چیت پێویستتە تەنانەت لەو کاتانەش کە
خۆت نەتدەزانی.

You maybe in situation that feels hopeless,
but Allah still has a plan.
He can bring greatness out of a great mess.
Trust Him.

ڕەنگە لە دۆخێکدا بیت کە هەست بە بێهیوایی بکەیت،
بەڵام هێشتا خودا پلانی هەیە. دەتوانێت شکۆداری لە
گێژاوێکی گەورە دەربهێنێت متمانەی پێ بکە.

When you are suffering and feel like no help comes your way, then perhaps Allah is using this as means to expiate your sins.

ئەو دەمەی ئازار دەچێژیت و وا هەست دەکەیت هیچ یارمەتییەک نادرێیت، ئەوا ڕەنگە ئازارەکەت وەک هۆکارێک بۆ لێخۆشبون لە تاوانەکانت بەکاربهێنێت.

Sometimes Allah attaches your heart to that which isn't written to be yours, so you may realise that not everything you love is good for you.

هەندێ کات خودا دڵت وابەستەی شتانێک دەکات
کە هی تۆ نیین،هەر بۆیە ڕەنگە درک بەوە بکەیت کە
هەموو ئەو شتانەی خۆشت دەوێن باش نین
بۆت(لەبەرژەوەندی تۆدا نین).

One day you will thank Allah for the door He has closed. You will be grateful that it didn't work out for you.

Allah's plans are better than our wishes.

ڕۆژێک دادێ سوپاسی خودا دەکەیت
بۆ ئەوەی دەرگاکەی لێ دایخستیت.
سوپاسگوزار دەبیت کە بۆت نەکرایەوە (سودی بۆت نەبوو) پلانەکانی خودا لە خۆزگەکانمان باشترن.

One day you will thank Allah for the door He has closed. You will be grateful that it didn't work out for you.

Allah's plans are better than our wishes.

ڕۆژێک دادێ سوپاسی خودا دەکەیت

بۆ ئەوەی دەرگاکەی لێ دایخستیت.

سوپاسگوزار دەبیت کە بۆت نەکرایەوە (سودی بۆت نەبوو) پلانەکانی خودا لە خۆزگەکانمان باشترن.

When your failures surround you,
and all the open doors have closed, look up.
There's a door that never closes, a way,
when all the other ways have failed you.

کاتێک شکستەکانت دەوریان دایت،
هەموو دەرگا کراوەکان داخران، سەرت بەرز بکەرەوە.
دەرگایەک هەیە هەرگیز داناخرێت، لەو ساتانەی ڕێگەکانی دیکە شکستیان پێ هێنایت.

Allah knows exactly what to give you
to help you return to Him.
The events in your life are purposeful,
appropriate and non-random.

خودا کتومت دەزانێت چیت پێبدات
بۆ ئەوەی یارمەتیت بدات بگەڕێیتەوە لای خۆی.
ڕووداوەکانی ژیانت ئامانجدارو گونجاون و هەڕەمەکی نین.

Allah by His grace has given you some blessing, some bounty. So, the best way to be thankful to Allah is to use that bounty and blessings to bring the people of Allah close to Allah.

خودا بە فەزڵی خۆی هەندێک نیعمەت و خەڵاتی پێ بەخشیویت. کەواتە، باشترین ڕێگە بۆ سوپاسگوزاری خودا ئەوەیە کە ئەو خەڵات و نیعمەتانە بۆ نزیک کردنەوەی خەڵکی لە خودا بەکاربهێنیت.

Allah will never disappoint the sincere caller. Even when you think He hasn’t answered you, He plans in your favor.

خودا هەرگیز کەسی دڵسۆز بێهیوا ناکات.
تەنانەت کاتێک پێت وایە وەڵامی نەداویتەوە،
ئەو لە بەرژەوەندی تۆدا پلان دادەنێت.

Love of Allah gives us spiritual life, hope in His Reward is the greatest incentive to do good, and fear of His Wrath stops us from evil.

خۆشەویستی خودا ژیانی ڕۆحیمان پێ دەبەخشێت،هیوا بە پاداشتی ئەو گەورەترین هاندەرە بۆ چاکەکردن،و ترس لە تووڕەیی ئەو لە خراپە دەمانپارێزێت.

The prophet (PBUH) said:
The deeds most loved by Allah are
those done regularly, even if they are small.

پێغەمبەر(درودی خودای لەسەر بێت) فەرموویەتی:
ئەو کردارانەی کە خودا زۆر خۆشی دەوێن ئەوانەن
کە بە بەردەوامی ئەنجام دەدرێن ئەگەر بچوکیش بن.

Remember this:

First, comes the trial. Second, comes the patience And finally, with your perseverance and faith The hardship will end Happiness will say hello And you will be one of the victorious For believing in Allah's promise That He will not burden a person beyond his capability.

ئەمەت بیر بێت:

یەکەم، تاقیکردنەوە دێت. دووەم، ئارامگری دێت و لە کۆتاییدا، بە خۆڕاگری و ئیمانەکەت سەختی کۆتایی دێت بەختەوەری سڵاو دەکات و تۆش یەکێک دەبیت لە سەرکەوتووەکان بۆ باوەڕبوون بە بەڵێنی خودا کە بارگرانی ناخاتە سەر مرۆڤێک کە لە توانای خۆی زیاتر بێت.

Never say "why me"
Allah tested Nuh with a flood, Ibrahim with a fire, Ya'qub with blindness, Yusuf with separation, Ayyub with illness, Musa with tyrants, Harun with betrayal, Yunus with patience, Sulayman with a kingdom and Dawud with war.
Tests will come Never say "why me?"

هەرگیز مەڵێ "بۆچی من"
خودا نوحی بە لافاو، ئیبراهیمی بە ئاگر،
یەعقوبی بە کوێرەوەری، یوسف بە دابڕان،
ئەیوبی بە نەخۆشی، موسا بە ستەمکاران،
هارونی بە خیانەت، یونس بە سەبر،
سولەیمان بە شانشینی و داودی بە جەنگ تاقی کردەوە.
تاقیکردنەوەکان دێن هەرگیز مەڵێ "بۆچی من؟"

Don't keep asking why bad things happen to good people. Allah has promised us that we will all be tested.

He puts us through tests because He knows when you're at your lowest that you're most likely to get closer to Him.

بەردەوام پرسیار مەکە لەوەی بۆچی شتە خراپەکان بەسەر مرۆڤە باشەکاندا دێن؟

خودا بەڵێنی پێداوین کە هەموومان تاقی دەکرێینەوە.

ئێمە دەخاتە ژێر تاقیکردنەوەکانەوە، چونکە دەزانێت کاتێک لە نزمترین ئاستی خۆتدایت زۆرترین ئەگەری ئەوەت هەیە لێی نزیک بیتەوە.

Five reasons why Allah puts us through trials.

To direct you (He wants us always to return to Him).

To inspect you (to test your faith).

To protect you (from misgiudance).

To correct you (from your sins and straying).

To perfect you.

پێنج هۆكار كە بەهۆیانەوە خودا دەمانخاتە ژێر تاقیكردنەوەوە.

بۆ ئاراستەكردنت ( دەیەوێت هەمیشە بگەڕێینەوە بۆ لای).

بۆ ئەوەی پشكنینت بۆ بكات (بۆ تاقیكردنەوەی ئیمانت).

بۆ ئەوەی بتپارێزێت (لە بەلاڕێدانی هەڵە).

بۆ ئەوەی ڕاستت بكاتەوە (لە گوناهەكان و لادانەكانت).

بۆ ئەوەی كامڵت بكات.

Maybe Allah is making you wait because He wants to test your faith. And after all this patience, Allah will bring you happiness. And maybe what you want is already planned for you by The Best of Planners and in all of this wait period, Allah is making you ready to receive your Dream Dua.

لەوانەیە خودا وات لێ بکات چاوەڕێ بکەیت چونکە دەیەوێت ئیمانت تاقی بکاتەوە. وە دوای ئەم هەموو سەبرە،خودا بەختەوەرییت بۆ دەهێنێت.

ڕەنگە ئەوەی تۆ دەتەوێت پێشتر لەلایەن باشترین پلاندانەرەوە پلانی بۆ دانرا بێت وە لەم هەموو چاوەڕوانییەدا، خودا بۆ قبوڵبونی دوعای خەونەکانت ئامادەت دەکات.

So often we think that Allah only tests us with hardships, but this isn't true.
Allah also tests with ease.
He tests us with blessings and with the things we love, and it is often in these tests that so many of us fail. We fail because when Allah gives us these blessings, we unwittingly turn them into false idols in the heart.

زۆرجار وا دەزانین خودا تەنها بە سەختی و نارەحەتی تاقیمان دەکاتەوە، بەڵام ئەمە ڕاست نییە .
خودا بە ئاسانی(نیعمەت)یش تاقیمان دەکاتەوە.
ئەو بەو نیعمەت و شتانەی خۆشمان دەوێن تاقیمان دەکاتەوە و زۆرجاریش لەم تاقیکردنەوانەدایە کە زۆرێک لە ئێمە شکست دەهێنین. ئێمە شکست دەهێنین چونکە کاتێک خودا ئەم نیعمەتانەمان پێدەبەخشێت،
بێئاگاییانە لە دڵماندا بتێکی دروستکراویان لێ دەسازێنین.

Allah tests you in three ways:
He gives you what you want immediately to test your gratitude.
He gives you what you want with a delay to test your patience.
He doesn't give you what you want to test your faith.

خودا بە سێ شێوە تاقیت دەکاتەوە:
ئەوەی دەتەوێت دەست بە جێ پێت دەبەخشێت بۆ ئەوەی سوپاسگوزارییەکەت تاقی بکاتەوە.
ئەوەی دەتەوێت دواتر پێت دەبەخشێت بۆ ئەوەی ئارامیت تاقی بکاتەوە ئەو شتەی دەتەوێت پێت نابەخشێت بۆ ئەوەی باوەڕت تاقی بکاتەوە.

This life is only a test. You will get tested time after time, again and again.
Allah will make you worthy of entering His Jannah. He will see if you can maintain sabr and believe in His plans even on the days where you feel so defeated and broken.

ئەم ژیانە تەنها تاقیکردنەوەیەکە.
جار لە دوای جار، دووبارە و دووبارە تاق دەکرێیتەوە.
خودا شایستەیی ئەوەت پێ دەبەخشێت کە بچیتە ناو بەهەشتەکەیەوە. دەبینێت کە ئایا دەتوانیت سەبر بگریت و باوەڕت بە پلانەکانی هەبێت تەنانەت لەو ڕۆژانەشدا کە هەست بە شکست و شکانی زۆر دەکەیت.

Blessings come in packages of two.
With every blessing is a test.
So don't ever envy people who seem to have more than you The more blessings, the more tests and the greater the blessing, the harder the test.

نیعمەتەکان بە دوو شێوە دێن.
لەگەڵ هەموو نیعمەتێکدا تاقیکردنەوەیەک هەیە.
بۆیە هەرگیز ئیرەیی بە کەسانێک مەبە کە پێدەچێت لە تۆ تا نیعمەت زیاتر بێت، تاقیکردنەوەکان زیاتریان هەبێت وە تا نیعمەتەکە گەورەتر بێت، زیاتر دەبن تاقیکردنەوەکەش قورستر دەبێت.

Sabr is not easy and has never been. However, keep in mind that Allah is aware and will make sure that your effort is not wasted.

Your patience is highly valued in the Eyes of Allah

سەبر ئاسان نییە و هەرگیز ئاسانیش نەبووە.

هەرچۆن بێ لە یادت بێت، خودا ئاگادارە و دڵنیا دەبێتەوە لەوەی هەوڵدانەکەت بەفیڕۆ ناچێت.

ئارامگرتنەکەت لە چاوی خودادا بەهایەکی زۆری هەیە.

If you enjoy His Blessings,
you must also accept His Trials.
That's how it is. When you envy
the blessings of others, remember their trials.

ئەگەر چێژ لە نیعمەتەکانی وەردەگریت،
پێویستە تاقیکردنەوەکانیشی قبوڵ بکەیت.
بەو جۆرەیە. کاتێک ئیرەیی بە نیعمەتی کەسانی تر دەبەیت،
تاقیکردنەوە(ناخۆشەیە)کانیانت لەبیر بێت.

When Allah tests you,
He's testing how well you're able
to restore faith in your heart.
Be patient. Don't lose faith. Ease will come.

کاتێک خودا تاقیت دەکاتەوە،
تاقیت دەکاتەوە کە تا چەند بە باشی
دەتوانیت ئیمان لە دڵتدا بگەڕێنیتەوە.
ئارام بگرە. ئیمانت لەدەست مەدە. خۆشی دێت.

When you're going through something hard and you start wondering where Allah is, just remember, the Teacher is always quiet during a test.

کاتێک بە شتێکی سەختدا تێدەپەڕیت و
سەرت سوڕدەمێنێت لەوەی کە خودا لە کوێیە،
تەنها ئەوەت لەیاد بێت، لە کاتی تاقیکردنەوەدا هەمیشە
مامۆستا بێدەنگە.

Sabr is not remaining quiet and allowing anger to build up inside you.
Sabr is to talk about what's bothering you without losing control of your emotions.

سەبر  ئەوە نییە بێدەنگ بمێنیتەوە و
ڕێ بدەیت تورەیی لە ناختدا کەڵەکە ببێت.
سەبر ئەوەیە باسی ئەو شتە بکەیت بێزارت دەکات
بەبێ لەدەستدانی کۆنترۆڵی هەست و سۆزەکانت.

When you're not patient, you start complaining. And the fact that you're complaining is a sign that you're not grateful.

کاتێک سەبرت نییە، دەست بە گلەییکردن دەکەیت. وە ئەو ڕاستییەی کە گلەیی دەکەیت نیشانەیە بۆ ئەوەی سوپاسگوزار نیت.

When you suffer a loss, remember that Allah rewards you for your patience and endurance, far more than what you have lost.

کاتێک توشی زیان دەبیت،
بیرت بێت، بەزۆر زیاتر لەوەی لەدەستت داوە،
پاداشتی ئارامییەکەت دەداتەوە.

If you want to know the strength of your soul, look at how patient you are, how readily you accept His Will.

Don't break when you're bent!

ئەگەر دەتەوێت هێزی ڕۆحت بزانیت،

بزانە چەندە ئارامگریت،

چەندە بە ئامادەییەوە ئیرادەی ئەو قبوڵ دەکەیت.

کاتێک دەچەمێیتەوە، مەشکێ!

Patience is that the heart does not feel anger towards that which is destined
and that the mouth does not complain.

ئارامگرتن ئەوەیە دڵ هەست بە توڕەیی نەکات و دەمیش سکاڵا نەکات لەوەی کە قەدەرە.

Sometimes you may feel you are trapped in the same calamity time after time. Perhaps you have not learned your lesson, and that's why it re-occurs.

هەندێک کات لەوانەیە هەست بکەیت
جار لە دوای جار لە هەمان کارەساتدا گیرت خواردووە.
ڕەنگە وانەکەت فێر نەبوو بێت،
هەر بۆیەش دووبارە ڕوودەداتەوە.

If the journey of this dunya was easy, sabr would not be one of the doors of Jannah.

ئەگەر سەفەری ئەم دونیایە ئاسان بووایە،
سەبر یەکێک نەدەبوو لە دەرگاکانی بەهەشت.

Don't worry about what the people say. Sometimes they'll praise you. Sometimes they'll condemn you. All these things all fade away. And in the end, Allah takes care of everything Perfectly.

نیگەران مەبە لەوەی کە خەڵکی چی دەڵێن.
هەندێک جار ستایشت دەکەن.
هەندێک جار سەرزەنشتت دەکەن.
هەموو ئەم شتانە کۆتاییان دێت.
وە لە کۆتاییدا خودا بە بێ کەموکوڕی ئاگاداری هەموو شتێکە.

Look at sadness as a gift from Allah. After a long time of distancing yourself from Him, He wants you to turn back to Him in order to help you back to the right path. So, He puts you in a situation where the only way out is to turn back to Him.

وەک دیارییەک لەلایەن خوداوە سەیری خەمباری بکە.
دوای ماوەیەکی زۆر لە دوورکەوتنەوە لێی.
دەیەوێت بگەڕێیتەوە بۆ لای خۆی بۆ ئەوەی یارمەتیت بدات بگەڕێیتەوە بۆ ڕێگای ڕاست. کەواتە، تۆ دەخاتە دۆخێکەوە کە تاکە ڕێگەی دەربازبوون ئەوەیە کە بگەڕێیتەوە بۆ لای.

If you gain something, embrace it. And if you lose something, let it be. You don't always love what is best for you, and you don't always hate what is terribly wrong for you. Trust in Allah, He knows that which is best.

ئەگەر شتێکت دەست کەوت، قایل بە پێی.
وە ئەگەر شتێکت لەدەست دا، وازی لێ بهێنە.
هەمیشە ئەو شتانەت خۆشناوێت کە باشترینن بۆت،
هەروەها هەمیشە ڕقت لەوە نییە کە زۆر خراپە بۆت.
پشت بە خودا ببەستە، ئەو دەزانێت کامیان باشترینە.

Remember two matters and forget two matters; Remember Allah and death. Forget any good that you have done to another and any evil that was done to you by another.

دوو بابەتت لەبیر بێت و دوو بابەت لەبیر بکە؛
خودا و مردنت لەبیر بێت.
هەر خێر و چاکەیەکت کە لەگەڵ کەسێکی تردا کردبێت و هەر خراپەیەک کە لەلایەن کەسێکی ترەوە بەرامبەرت کرابێت لەبیری بکە.

Be aware!

If you do not know the blessings you have when you have them, then Allah will teach you about them by taking them away from you.

ئاگادار بە!

ئەگەرقەدری ئەو نیعمەتانەت نەزانی کە خاوەنیانیت،

ئەوا خودا بە وەرگرتنەوەیان لێت قەدریانت فێردەکات.

Appreciate what you have, and do not think of what you do not have. What you have is from Allah's blessing, and what you do not have is from Allah's wisdom.

قەدری ئەو شتانە بگرە کە هەتە،
وە بیر لەو شتانە مەکەرەوە کە نیتە.
ئەوەی هەتە لە ڕەحمەتی خوداوەیە،
وە ئەوەی نیتە لە حیکمەتی خوداوەیە.

Stop focusing so much on the few issues you have because they are all tiny in comparison to the blessings Allah has showered upon you.

چیدیکە تەرکیز مەخەرە سەر ئەو چەند کێشە کەمەی کە هەتەچونکە هەموویان زۆر بچوکن بە بەراورد بەو بەخششانەیکە خودا پێی بەخشیویت.

You must repent as soon as you sin
for death does not wait for your repentance.
We all sin but the best of us are those that repent.

هەر کە گوناهت کرد، پێویستە داوای لێخۆشبون بکەیت مردن چاوەڕێی تەوبەکردنت ناکات.
هەمووومان گوناە دەکەین بەڵام باشترینمان ئەوانەن کە تەوبە دەکەن.

Never put yourself in situations that are even close to the hararm. You think you're in control but when Shaytan is involved, you will not come out of that situation clean.

هەرگیز خۆت مەخەرە دۆخێکەوە
کە تەنانەت لە حەرامەوە نزیک بێت.
تۆ پێت وایە کۆنترۆڵی خۆت دەکەیت،
بەڵام کاتێک شەیتان بەشدارە،
تۆ بە پاکی لەو دۆخە نایەیتە دەرەوە.

The more you give, the more you'll get back. Even if it's not money, give your time, words and advice. He will reward you in greater ways!

تا زیاتر ببەخشیت، زیاترت بۆ دەگەڕێتەوە.

ئەگەر پارەش نەبێت.کاتت، وشەکانت و ئامۆژگارییەکانت ببەخشە.

بە شێوازی گەورەتر پاداشتت دەداتەوە.

Everyone is a sinner but not everyone asks for forgiveness. So do it constantly Forgiveness is a powerful way to bring you back to Allah.

هەموو کەسێک گوناهبارە بەڵام
هەموان داوای لێخۆشبوون ناکەن
بۆیە بەردەوام داوای لێخۆشبون بکە
لێخۆشبوون ڕێگەیەکی بەهێزە بۆ
گەڕاندنەوەی تۆ بۆ لای خودا.

There is a voice in your head that always tells you whether something is permissible or forbidden. Be wary of that voice it appears because of your faith in Allah.

دەنگێک لە هزرتدا هەیە کە هەمیشە پێت دەڵێت
کە ئایا شتێک حەڵاڵە یان حەرامە. ئاگاداری ئەو دەنگە بە
کە بەهۆی باوەڕت بە خودا دەردەکەوێت.

Be grateful for every single person who was part of your story. The ones that hurt you. The ones that helped you. Because they all taught you.

سوپاسگوزار بە بۆ هەموو کەسێک
کە بەشێک بوو لە چیرۆکەکەت.
ئەوانەی کە ئازاریان دایت. ئەوانەی کە
یارمەتییان داویت چونکە هەموویان فێریان کردیت.

Always be grateful for your guilt,
be grateful that you have that little
voice in your head reminding you of Allah,
reminding you what's good and bad.

هەمیشە سوپاسگوزار بە بۆ هەڵە و تاوانەکەت،
سوپاسگوزار بە کە ئەو دەنگە بچووکە لە سەرتدا
هەیە و خودات بیردەخاتەوە، باش و خراپت بیردەخاتەوە.

Worry and distress are two feelings that have connotations with haram relationship. An act of disobeying may, Will not make you happy for along period of time.

نیگەرانی و ناڕەحەتی دوو هەستن
کە پەیوەستن بە پەیوەندی حەرامەوە.
ڕەنگە کردەوەیەکی سەرپێچی،
بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ دڵخۆشت نەکات.

Strive for the Hereafter according to how long you shall remain there, and strive for this world according to how long you shall remain here.

هەوڵبدە بۆ ئەو دونیا بدە بەو پێیەی
پێویستە چەند لێی بمێنیتەوە،
وەهەوڵ بۆ ئەم دونیاش بدە بەو پێیەی
پێویستە چەندێ لێی بمێنیتەوە.

Learn from past experience and mistakes. Allah sent them for a reason. If the same situation happens again, draw on the lessons learnt.

له ئەزموون و هەڵەکانی ڕابردووتەوە فێربە.
خودا لەبەر هۆکارێک ناردنی.
ئەگەر جارێکی تر هەمان دۆخ ڕوویدا،
سوود لە وانە فێربووەکان وەربگرە و بەکاریان بهێنە.

Don't compare yourself to the one who has more. It's a dangerous path to take. You'll become bitter. He blesses us differently Give thanks.

خۆت بەراورد مەکە بەو کەسەی کە زیاتری هەیە.
ڕێگایەکی مەترسیدارە بیگریتەبەر.
توڕەو خەمبار دەبیت. خودا بە شێوەیەکی جیاواز
سوپاسگوزار بە. نیعمەتمان پێدەبەخشێت

Neither happiness nor grief are everlasting in this life, but one of the two is everlasting in the next Which one do you want?

نه بەختەوەری و نه خەم لەم ژیانەدا هەمیشەیی نین،
بەڵام یەکێک لەو دووانه له ژیانی داهاتوودا
کامەیانت دەوێت؟ هەمیشەییه

Don't depend too much on anyone in this world because even your own shadow leaves you when you are in darkness.

لەم جیهانەدا زۆر پشت بە کەس مەبەستە
چونکە تەنانەت کە لە تاریکیدایت، سێبەری خۆیشت بەجێت دەهێڵێت.

Never ever leave hope from two things:
Mercy of Allah, Power of dua
good things come to those who waits.
Trust Allah.

هەرگیزاو هەرگیز هیوا لەم دوو شتە لەدەست مەدە:
ڕەحمی خودا، هێزی دوعا
شتە باشەکان بۆ ئەو کەسانە دێن کە چاوەڕێ دەکەن.
متمانە بە خودا بکە.

Be the one who anticipates a great reward in Jannah instead of the one who wants Jannah but does nothing to get there.

ئەو کەسە بە کە چاوەڕوانی پاداشتێکی گەورە دەکات لە بەهەشتدا لەبری ئەو کەسەی کە بەهەشتی دەوێت بەڵام هیچ شتێک ناکات تا پێی بگات.

Treat your parents with kindness and love, your children will watch and learn, and treat you the same.

به میهرەبانی و خۆشەویستی مامەڵە لەگەڵ دایک و باوکت بکە، منداڵەکانت سەیر دەکەن و فێر دەبن،
ئەوانیش بە هەمان شێوە مامەڵەت لەگەڵ دەکەن.

If your parents are alive,
be grateful at the opportunity
to earn Jannah by serving them.

ئەگەر دایک و باوکت لە ژیاندان،
سوپاسگوزار بە کە دەرفەتی بەدەستهێنانی
بەهەشتت هەیە بە خزمەتکردنیان.

Remind yourself that nothing lasts forever, not even your parents. So. Love them whilst you still have them.

بیری خۆت بخەرەوە کە هیچ شتێک بۆ هەمیشە نامێنێتەوە،تەنانەت دایک و باوکیشت.
هەربۆیە. خۆشت بوێن لە کاتێکدا هێشتا ئەوانت هەیە.

Dear Allah

Protect my mother for truly she has made me happy without anything in return. Make her happy in this life and the next. Ameen.

خوایە گیان

دایکم بپارێزە چونکە بەڕاستی دڵخۆشی کردووم بەبێ ئەوەی هیچ شتێک وەرگرێ لەبەرامبەردا. لەم ژیانە و لە ژیانی داهاتووشدا دڵخۆشی بکە.

ئامین.

Dear Allah
Protect my father for truly he has made me feel safe without anything in return. Make him feel safe in this life and the next.

خوایە گیان
باوکم بپارێزە چونکە بەڕاستی وای لێکردووم هەست بە سەلامەتی بکەم بەبێ ئەوەی هیچ شتێ لە بەرامبەردا وەربگرێت وای لێبکە لەم ژیانە و لە ژیانی داهاتوودا هەست بە سەلامەتی بکات.

The sweetness of this life is found in remembering Allah,
the sweetness of the next life will be found in seeing Him.

شیرینی ئەم ژیانە لە یادی خودادایە،
شیرینی ژیانی داهاتوو لە بینینی ئەودایە.

Morals and manners are very important characteristics in Islam.
It is your morals and manners that define who you are.

ئەخلاق و ڕەوشت تایبەتمەندییەکی زۆر گرنگن
لە ئیسلامدا ئەوە ئەخلاق و ڕەوشتی تۆیە
کە پێناسەی ئەوە دەکات تۆ کێیت.

When your failure brings you closer to your Creator, That's NOT failure.
That is your success. Thank Allah for it.

کاتێک شکستەکەت نزیکت دەکاتەوە لە دروستکەرەکەت،
ئەوە شکست نییە ئەوە سەرکەوتنی تۆیە.
سوپاسی خودا بکە بۆ ئەو شتە.

Sometimes Allah gives you bitterness in this life so that you can further enjoy the sweetness of the hereafter.

هەندێک جار خودا لەم ژیانەدا تاڵیت پێدەبەخشێت
بۆ ئەوەی زیاتر چێژ لە شیرینی ژیانی داهاتوو وەربگریت.

When you rectify your relationship with the Creator, He rectifies your relationship with all of the creation.

کاتێک پەیوەندیت لەگەڵ دروستکەردا ڕاست دەکەیتەوە، ئەو پەیوەندیت لەگەڵ هەموو دروستکراوەکاندا ڕاست دەکاتەوە.

Allah always has three replies to our prayers:

Yes.

Yes but not now.

I have a better plan for you.

خودا هەمیشە سێ وەڵامی بۆ نزاکانمان هەیە:

بەڵێ.

بەڵێ بەڵام ئێستا نا.

پلانێکی باشترم بۆ تۆ هەیە.

Consider the fact that maybe Allah closed that door because He knew you were worth so much more.

بیر لەو ڕاستییە بکەرەوە کە ڕەنگە خودا ئەو دەرگایەی داخستبێت چونکە دەیزانی تۆ شایستەی زۆر زیاترت.

Insulting the Prophet (Peace Be Upon Him)
is like trying to spit at the sun,
it will only come back in your face.

سوکایەتیکردن بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت)
وەک ئەوە وایە هەوڵبدەیت تف لە خۆر بکەیت، تەنها بۆ
ڕوخساری خۆت دەگەڕێتەوە.




Description

بسم الله الرحمن الرحیم
🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایان سارا نامیق کراوە بەpdf**
**پێویستی بە دوعایە دوعای خێری بۆ بکەن**

چەنال
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

Sincerity causes the smallest of good deeds to become the largest.

دڵسۆزی دەبێتە هۆی ئەوەی بچوکترین کردەوە چاکەکان ببنە گەورەترین.

When you give, expect nothing from people and everything from Allah.

کاتێک دەبەخشیت، چاوەڕوانی هیچ شتێک لە خەڵک مەکە و چاوەڕوانی هەموو شتێک لە خودا بە.

Never forget the favors done for you. Always forget the favors you've done for others.

هەرگیز ئەو چاکانە لەبیر مەکە کە بۆت کراون.
هەمیشە ئەو چاکانە لەبیر بکە کە بۆ کەسانی ترت کردوون.

Kind words cost you nothing but are sometimes worth more than a million dollars.

وتنی وشه میهرەبانییەکان هیچی تێ ناچێ بۆت،
بەڵام هەندێ کات بەهای زیاتر لە ملیۆنێک دۆلاریان هەیە.

Guilt is a gift from Allah warning you
that what you are doing is violating your soul.

هەست بە تاوانباربوون دیارییەکە لەلایەن خواداوە
ئاگادارت دەکاتەوەکە ئەوەی دەیکەیت پێشێلکردنی ڕۆحتە.

Beware of what you let enter your heart. There will come a day when you'd give anything to remove it.

ئاگاداربە لەوەی کە ڕێگە بە چی شتێک دەدەیت بچێتە ناو دڵتەوە چونکە ڕۆژێک دێت هەر شتێک کە هەتە دەدەیت بۆ لابردنی.

You never know which your good deed could be your ticket to Jannah.

هەرگیز نازانیت کام کارە باشەت
دەبێتە بلیتی چونە بەهەشتت.

When Allah puts you through difficulty, He also grants you the strength to get through it.

کاتێک خودا دەتخاتە ناو سەختییەوە،
هێزی ئەوەشت پێ دەبەخشێت کە پێیدا تێپەڕ ببیت.

Allah will give you what is best for you,
even it takes time.

خودا باشترین شتت پێتدەبەخشێت،
تەنانەت گەر کاتیش بخایەنێت.

Worrying does not change anything,
but trusting Allah changes everything.

نیگەرانی هیچ شتێک ناگۆڕێت،
بەڵام متمانەکردن بە خوا هەموو شتێک دەگۆڕێت.

